# چەند هەنگاوێک بۆ بەردەوام بوون لەدوای ڕەمەزانی پیرۆز

بەرهەمی پرۆژەی ئاگا.... (3)

2022

سالار عومەر

## ناسنامەی نامیلکە:

**ناوی نامیلکە: چەند هەنگاوێك بۆ بەردەوام بوون لەدوای ڕەمەزانی پیرۆز.**

**نوسین: سالارعومەر**

**پێداچوونەوە: مشتاقة الحبیب**

**وشەسازی: ژاڵە محمد**

**بەرهەمی پڕۆژەی ئاگا .**

## دەست پێك:

لە ڕاستیدا ڕەمەزان بە مانای قوتابخانە و خوێندنگایە، قوتابخانەی تەزکیە وخاوێن کردنەوەی دڵ و دەروون لە هەرچی ڕەزیلی و ناحەزییە، قوتابخانەی ڕاهێنانی نەفسە لەسەر چاکە و عیبادەت و ڕەوشت و ئاکارە بەرزەکانە.
ڕەمەزان دەرفەتێکی زێڕینە بۆ لێخۆش‌بوون لەگوناح و قەرەبوو کردنەوەی ڕابردوو، هەروەها پەروەردە و ئامادە بوونە بۆ داهاتوو، دەرفەتێکە بۆ خاوێن کردنەوەی دڵ و دەروون لە هەرچی ڕەزیلی و پەستی و ناڕێکی و کاری نەشیاو و ڕق و قینەیە.
ڕەمەزان گەورەترین قوتابخانەیە بۆ فێربوونی بەندایەتی خوای گەورەیە، پێویستە وانەیەک کە لەو خوێندنگایە فێری دەبین لەبیری نەکەین، بەڵکو بەردەوام لەسەری بین و لەگەڵی بژین تا ڕەمەزانێکی‌تر، ئەو وانەیە لەسەر خۆمان جێبەجێ بکەین و لە

زمان و دڵ و کردارماندا ڕەنگ بداتەوە و بەدرێژایی ساڵ بەردەوام بین تا بەتەواوی لەسەر پەروەردەی ئیسلامی ڕادێین و شیاوی بەندایەتی ڕاستەقینەی خوا دەبین، نەک لەگەڵ کۆتایی هاتنی مانگی ڕەمەزان قورئانەکان بپێچین و لەسوچێکی مزگەوت یان کتێبخانەکانمان دایانبنێین و ئەندامەکانی لاشەمان لەکاربکەون بەرامبەر عیبادەتەکان.

ساڵانە لەمانگی ڕەمەزانی پیرۆز موسڵمانان بەگشتی ڕوو لە مزگەوتەکان دەکەن و بەنیەتێکی پاکەوە بەرەو بەندایەتی خوای گەورە دەچن و پەرستنە جۆراوجۆرەکانی وەکو ( خێر و زەکات و قورئان خوێندن و شەو نوێژ و نزاکردن و...تاد) ئەنجام دەدەن.

موسڵمانان نەفسیان لەچەوتی و ڕەزیلی و هەوەس خاوێن دەکەنەوە، تابتوانن چاکە دەکەن و خۆیان لەخراپە دەپارێزن

لە دەرەنجامدا ڕوح دەگەشێتەوە، ئیمان لە گوتار و کرداردا ڕەنگ دەداتەوە و دڵەکان ڕووناک دەبنەوە.

بەڵام دوای ڕەمەزان ئەو گەرم و گوڕییە نابینیت موسڵمانان لەپەرستنەکانیان کەمتەرخەمی دەنوێنن، جا بۆ ئەوەی ئێمەی موسڵمان تووشی ئەم جۆرە ساردبوونەوەیە نەبین پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:

**یەکەم: بەندایەتی کردنێکی دروستی خوای پەروەردگار:**

با پرسیارێک لە خۆمان بەکەین! کە ئایا پەرستنی خوای گەورە و بەندایەتی کردنی ئەو زاتە پاکە بەس بۆ کاتێکی دیاری کراوە؟ ئایا تەنیا لە مانگی ڕەمەزاندا پەرستنی خوا لەسەرمان پێویستە؟

خوای گەورە دەفەرموێت: **(وَ مَا خَلَقتُ الجِنَّ وَ الإِنسَ إِلَّا لِيَعبُدُون)**، واتە: جنۆکە و مرۆڤم دروست کردووە تەنها بۆ ئەوەی من بپەرستن .

لە ڕاستیدا نە خوای ڕەمەزان و دوای ڕەمەزان جیاوازە، نە فەرمانەکانی لە ڕەمەزان و دوای ڕەمەزاندا جیاوازن، بەپێی ئەم ئایەتەی خوای گەورە ئێمە لەتەواوی تەمەنمان لەکات و ساتی خۆشی و ناخۆشی لەساغی و نەساغی لەهەژاری و دەوڵەمەندی و هەموو چرکەساتەکانی تەمەنمان دەبێت بەندایەتی بۆخوا بکەین.

گەر لەڕەمەزان خۆت دادەپۆشیت و عابا دەکەیت گەر نوێژەکانت لەکات و ساتی خۆتدا ئەنجام دەدەیت و دەستی لێ هەڵناگریت، گەر نوێژەکانت بەکۆمەڵ دەکەیت و جگەرە ناکێشیت، گەر خۆت لەشتە حەرامەکان دەپارێزیت و ئەنجامیان نادەیت، دوای ڕەمەزانیش هەمان کردەوە پێویستە

لەسەرت ئەنجامی بدەیت، چونکە ئەمانە فەرمانی خوای گەورەن و بۆ تەواوی ژیانت ئاراستە کراوە نەک کاتێکی دیاریکراو.

کەواتە هەر الله خوایە، هەر ئەو زاتە مەزنە تاکە پەروەرێنەرمانە و تاکە فەرمانڕەوامانە بۆ گوێڕایەڵی و هەوڵ دان بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو.

خوای گەورە تەنیا لەوە ڕازیە کە بەردەوام بیپەرستین بەبێ هیچ هاوبەش دانانێك، وە دەست بەئاینەکەیەوە بگرین و هەرگیز دەست بەرداری نەبین، پێغەمبەری خوا صلى اللهعليهوسلم دەفەرموێت: (إنَّ اللهَ يَرْضى لَكُمْ ثَلاثًا، ويَسْخَطُ لَكُمْ ثَلاثًا، يَرْضى لَكُمْ: أنْ تَعْبدُوهُ وَلا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وأنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَمِيعًا ولا تَفَرَّقُوا، وأنْ تُنَاصِحُوا مَنْ ولاهُ اللهُ أمْرَكُمْ؛ وَيَسْخَطُ لَكُمْ ثَلاثًا: قيلَ وقالَ،

**وكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وإِضَاعَةَ الْمَالِ)**[1].واتە:بەدڵناییەوە خوای گەورە لەسێ شتدا لێتان ڕازییەو لەسێ شتیشدا لێتان ڕازی نییە ،لێتان ڕازیدەبێت کەبیپەرستن و هاوبەش (شەریکی) بۆدانەنێن، هەروەها دەست بگرن بەئاینەکەیەوە و دووبەرەکی درووست مەکەن، ئەگەر پێشەوایەکی بۆتان نارد ئامۆژگاری بکەن، لەسێ شتدا لێتان نارازییە قیل و قال گۆتی وایان گوت، زۆر پرسیارکردن، ماڵ بەفیڕۆدان.

بەڕاستی لەسەر موسڵمانان پێویستە وریا بن و باشتر خودا بناسن و دەست بەدینەکەیەوە بگرن تا لەزەرەرمەندان نەبن بەڕووێکی جوانەوە بگەڕێنەوە لای پەروەردگاریان.

---

[1] صحيح مسلم برقم (١٧١٥)

## دووەم: گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا:

پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: (مَن أطَاعَنِي فقَدْ أطَاعَ اللَّهَ، ومَن عَصَانِي فقَدْ عَصَى اللَّهَ...)[1]

واتە: ئەوەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی من بکات؛ ئەوا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورەی کردووە، ئەوەی سەرپێچی فەرمانەکانی من بکات؛ ئەوا سەرپێچی فەرمانەکانی خوای گەورەی کردووە.

لەم فەرموودە شیرینەدا پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- ئەوە ڕووندەکاتەوە کە گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی ئەو وەکو گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی خودایە، پێغەمبەر -صلى الله

---

[1] الراوي : أبو هريرة | المحدث : البخاري | المصدر : صحيح البخاري/الصفحة أو الرقم | ٢٩٥٧ :خلاصة حكم المحدث] : صحيح] التخريج : أخرجه البخاري (٢٩٥٧)، ومسلم (١٨٣٥)

علیه وسلم- تەنها فەرمان دەکات بە جێبەجێکردنی ئەو شەریعەتەی کە خوای گەورە بۆ خۆی وبۆ ئومەتەکەی دایناوە، ئەگەر پێغەمبەر -صلى الله علیه وسلم- فەرمان بە شتێک بکات ئەوا لە شەریعەتی خودایە -سبحانه وتعالى-، ئەوەی گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بکات وەکو ئەوە وایە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خودای کردبێت، وئەوەی سەرپێچی فەرمانەکانی بکات وەکو ئەوە وایە سەرپێچی فەرمانەکانی خودای کردبێت.

کەواتە بێ هیچ دوو دڵییەک دەبێت بەتەواوی هەموو فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەری خوا وەربگرین و کاریان پێبکەین و لەژیانمان ڕەنگ دانەوەی هەبێت تا بسەلمێنین کە ئێمە شوێن کەوتەو گوێڕایەڵی پێغەمبەر ین.

## سێ یەم: ڕووکردنە قورئانی پیرۆزو خوێندنەوەو لەبەرکردن و کارپێکردنی:

قورئانی پیرۆز مایەی دامەزراوییە و بۆ هەموو ژیان و کات و ساتەکانی مرۆڤە نەك تەنها تایبەتی بکەین بە مانگی ڕەمەزان، خوای گەورە دەفەرموێت: **(وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً وَاحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا)**[1] واتە: کافرەکان (بیانوویەکی تریان گرت و) وتیان: ئەوە بۆ قورئان بە یەک جار بۆی ڕەوانە ناکرێت، بێگومان ئێمە هەر بەو شێوەیە ڕەوانەی دەکەین، تا دڵی تۆ زیاتر دڵنیا بکەین، بەردەوام بەجوانی دایدەڕێژین و دەیگەیەنین.

گەر وابزانیت قورئان تایبەتە بەمانگی ڕەمەزان دڵنیابە ئەوە بەهەڵە تێگەیشتنە لە قوڕئان، چونکە قوڕئان بەرنامە و ڕێ

---

[1] [الفرقان :٣٢ ].

نیشاندەری ژیان و مایەی هیداتە و جیاکەرەوەی حەقە لەباتڵ، وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: «الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ»[١] مانگی ڕەمەزان، ئەومانگەیە کە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارەوە، واتە: لەڕەمەزاندا (دەست بەناردنی کراوە) ڕێنمایی خەڵکی دەکات و چەندین بەڵگەو نیشانەی زۆر ڕوونی تێدایە بۆ جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست.

گەر سەرنج بدەین لێرەشدا خوای باڵادەست دەفەرمێت لە مانگی ڕەمەزان قورئانی پیرۆز نێردراوەتە خوارەوە، وەکو ڕێزێک بۆ گەورەیی مانگی ڕەمەزان، بەڵام خوای گەورە نافەرمێت لە مانگی ڕەمەزان قورئانی پیرۆز بخوێنە و کاری پێ بکە، بۆیە

[١] البقرة (١٨٥)

ناکرێت ئێمە تەنها لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بیخوێنینەوە و کاری پێبکەین.

ڕوون و ئاشکرایە کە بەرنامەی ڕێنوێنی بەس بۆ کاتێکی کورت و دیاری کراو نییە، بەڵکو دەبێ بەردەوام ئەو قورئانە لەسەر زار و نێو مێشک و دڵمان دابێ قسەو کردارمان بە پێێ قورئان بێ، چونکە تاکە یاسای ژیانی ئیمانداره و هۆکاری گەیشتن بە بەختەوەری هەر دوو دنیا و لە ڕۆژی دواییدا تکا بۆ هەڵگران و خوێنەرانی دەکات بە بەڵگەی ئەم فەرموودەی سەروەرمان ﷺ کە دەفەرمێت(اقرأوا القرآن، فإنه يأتي شفيعا لأصحابه يوم.القيامة) موسلیم ڕیوایەتی کردووه، و چەندین سوودی دەروونی هەیە کە لێکۆڵینەوە زانستییە ڕۆژئاواییەکان سەلماندوویانە(لە کاتێکدا ئەوان دژی ئیسلامن)، و شیفایە بۆ هەر کەسێک تەواو باوەڕی پێی هەبێت.

ئایا ڕەوایە کتێبێک بەم مەزنی و پیرۆزیی و پڕ سوود و ڕێنیشاندەرییەی لە ١٢ مانگدا یەک مانگ بخوێنرێتەوە و گرنگی پێ بدرێت!.

ئایا وازهێنان و هەجرکردنی[١] قورئانی پیرۆز لەو پەڕی نەزانی و داماوییدا نییە، لە کاتێکدا ئەم هەموو سوودەی هەیە!!!!

و لە هەمان کاتدا لە چەندین ئایەت تیایدا فرمانمان پێکراوە کە بەردەوام بیخوێنینەوە و کاری پێ بکەین، لەوانە:-

لە سورة العنكبوت - ئایەتی ٤٥ و لە سورەتی الكهف_ئایەتی٢٧

(اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ) بیخوێنەرەوە ئەو قورئانەی کە سرووشت بۆ کراوە.

---

[١] (هەجرکردن واتە گوێ پێنەدان و گرنگی پێنەدانی و بەناحەق شتی لەسەر بلێی و وازهێنان لە خوێندنەوە و گوێ گرتن و کارپێکردنی.....)

لە سورة النمل - ئايەتى ٩١_٩٢ **( وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ✸ وَأَنْ أَتْلُوَ الْقُرْآنَ...)** وە فەرمانم پێ دراوە لە موسوڵمانان بم ✸ وە فەرمانم پێ دراوە کە قورئان بخوێنم.

گەر فرمان بە پێغەمبەری نازدارمان ﷺ کرا بێت قورئان بخوێنێتەوە و لە کاتێکدا تەواوی قورئانی پیرۆزی لەبەر بوو، جا بۆ ئێمە چی!.

ئایا ڕەوایە ئەم فەرمانەی پەروەردگارمان جێ بەجێ نەکەین کە لەچەندین جێگادا فەرمانمان پێکراوە!.

بۆ گەیشتن بەئامانج پێویستە بەردەوام لەگەڵ قوڕئان بین و لێی دوور نەکەوینەوە، هەموو ڕۆژێ ئەو کتێبە بخوێنینەوە و لێی ورد بینەوە و بزانین کە بەچی فەرمانمان پێ دەکات و لە چیمان دەگێڕێتەوە.

پێویستە ئاگاداری خۆمان بین لە وازهێنان و هەجرکردنی قورئانی پیرۆز چونکە گەر هەجرکردنەکەت بەوە بێت باوەڕت

پێی نەبێت پێی کافر دەبیت و گەر هەجرکردنەکەت بەوە بێت فرمانەکانی جێ بەجێ نەکەیت و لەوانە دوور نەکەویتەوە کە نەهی لێکردووە و قەدەغەی کردووە ئەوا تاوانباریت، بەپێی شێوازی هەجرکردنەکەت سزاکەت دەگۆڕێت ، و پێویستە هەجرکردنی قورئانی پیرۆزش بە کەم سەیر نەکەین، چونکە سەرپێچی فرمانێکی خوای گەورەیە کە لە چەندین جێگا فرمانی پێکردووە.

وە ئاگاداربە کە تۆ قورئانی پیرۆز دەخوێنێت و کاری پێناکەیت وا دانەنێت کە هەجرت نەکردووە،

کە تۆ گوێ لە قورئانی پیرۆز دەگریت و کاری پێناکەیت وا دانەنێت کە هەجرت نەکردووە،

ئیبن قەییم ڕەحمەتی خوای مەزنی لێبێت شێوازەکانی هەجرکردنمان بۆ دەژمێرێت:-

یەک، باوەڕت پێی بێت و هەجری بکەیت بە گوێ لێ نەگرتنی.

دوو، بیخـــوێنیتەوە و بـــاوەڕت پێـی بێــت و هەجــری بکەیــت بەکارپێنەکردنی.

سێ، هەجرکردن بە کارپێنەکردن بە یاساکانی.

چـــوار، هەجرکردنــی بە بیــر لێنەکــردنەوە و تێنەگەشـــتن لە واتاکانی.

پێنج، هەجرکردنی بە بەکارنەهێنانی وەکو شیفایەک بۆ تەواوی نەخۆشییە دڵییەکان.

هەمـوو ئەمـانە قسـەی خـوای گەورە**(إنَّ قَـومي اتَّخَـذوا هٰـذا القُرآن مَهجُوراً)** دەیانگرێتەوە.

سـەرەڕای ئەمەش زۆرێـک لە موسـڵمانان بگـرە لە مـانگی پیـرۆزی ڕەمەزانــش قورئــانی پیــرۆز هەجــر دەکەن وا دەزانــن تەنهــا خوێندنەوەی بەسە، بەڵام لە ڕاستییدا وەها نییە...

بۆیە پێویستە زۆر ئاگاداری خۆمان بین بەرامبەر ئەم نیعمەتە گەورەی پەروەردگــاری بەخشـــندەمان و هەجــری نەکەیــن و

سوپاسگوزاری بین و دڵمان پێی خۆش بێت و ئومێدمان پێی هەبێت کە لە ڕۆژی دواییدا تکامان بۆ بکات، لەو ڕۆژەی کە دایک ئاگای لە منداڵی خۆی نییە و لە خەمیدا نییە، هەمووان دەڵێن خۆم خۆم جگەلە نازدارمان ﷺ .

لە هەمانکاتدا ترسی تەواویشمان هەبێت لەسزای پەروەردگارمان کاتێک کە هەجری ئەم بەخششەی پەروەردگاری باڵادەست و دادوەرمان کرد، چونکە بەڕاستی سزای پەروەردگارمان قورسە گەر فرمانەکانی جێبەجێ نەکەین.

## چوارەم: بەردەوامبوون لەئەنجامدانی کرداری چاك و خۆپاراستن لە تاوان:

خوای گەورە دەفەرموێت: (....وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا)[١] واتە: جا ئەگەر بەڕاستی ئەوانە بەگوێرەی ئامۆژگاری و فەرمانی ئێمە ڕەفتاریان بکردایە، ئەوە چاکتر بوو بۆیان و دامەزراوترو چەسپاوتر دەبوون لەسەر حەق و ڕاستی.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: (الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ ۚ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ ۖ فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَىٰ )[٢] واتە: ئەوانەی

---

[١] [النساء:٦٦ ].

[٢] النجم (٣٢)

کەخۆیان دەپارێزن لەگوناهـ و تاوانەگەورەکان لەگوفتارو کرداری بەد جگە لە وردە گوناهەکان، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەی ئیماندار چاوپۆشی زۆر فراوانە، ئەو بەهەموو کاروبارتان لەخۆتان زاناترە کارتێك دروستی کردوون لەسەر زەویدا، کەواتەخۆتان بەچاك مەزانن و خۆتان بەپاڵفتە دامەنێن، خوا زاناترە بەو کەسەی پارێزکارە.

بەردەوامبوون لەسەر کردەوەی چاك خۆشەویست ترین کردەوەیە لەلای خوای گەورە پرسیار یان کرد لەپێغەمبەری خوا صلى اللهعليهوسلم گوتیان: أَيُّ الْأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ چ کردەوەیەك لەلای خوای گەورە لەهەموویان خۆشەویست ترە؟ پێغەمبەر صلى اللهعليهوسلم فەرمووی:" أَدْوَمُهَا وإِنْ

**قَلَّ.**[1]: بەردەوامبوون لەسەر کاری چاك ئەگەر کەمیش بێت.واتا خوای گەورە ئەم بەندایەتیە کەمەی پێ خۆشترە کەبەردەوامە نەوەك بەندایەتیەکی زۆری پەڕ پەڕ.

**پێنجەم: سەرخستن و پشتیوانی کردنی دینی خوا:**

خوای گەورە دەفەرموێت: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَنْصُرُوا اللَّهَ يَنْصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ)**[2] واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە، ئەگەر ئێوە پشتیوانی لە ئاینی خوا بکەن و هەوڵی سەرکەوتنی بدەن، ئەوەخوایش پشتیوانی لەئێوە دەکات و سەرتان دەخات و پایەدارو جێگیرتان دەکات.

---

[1] رواه أحمد (٢٥٣٥٦)

[2] [محمد :٧ ].

## شەشەم: تەوبە و گەڕانەوە و بەردەوام بوون لەسەری لەتەواوی ژیانت:

پێویستە لەسەر هەر موسڵمانێك خۆی بۆ ئامادە بكات.ئەو ئامادەكردنەش سەرەتا بە گەڕانەوە بۆ لای خوای گەورە و پاشگەز بوونەوە و پەشیمانی لەو تاوان و سەرپێچیانەی كردوویەتی ئەویش بە تەوبە كردنێكی نەسوح كە نەگەڕێتەوە سەری تا سەركەوتوو و سەرفرازی دنیا و قیامەت بێت هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: [وَتُوبُوا إِلَى اللهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ].

تەوبە كردن لەسەر هەموو كەسێك پێویستە،بەڵام سووربیت لەسەر وازهێنان لە تاوان و سەرپێچییەكانت و پەشیمان بیت لەو تەمەنەی بەبێ سوود لە كیست چووە و زیادەڕەویت تێداكردووە،سوور بە لەسەر نەگەڕانەوە سەر تاوان.بە باشترین شێوە پەرستن بكە و خوای گەورە لە خۆت ڕازی بكە

بەڵکو لەوانە بیت کە خوای گەورە لێیان ڕازی بێت و لێت خۆش ببێت وە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارت بکات.

**تەوبەی نەسوح دەرگای سەرکەوتنت لێ دەکاتەوە بە مەرجێك:**

-ڕیشەکێش کردنی تاوان واتە واز لێهێنان بەیەکجاری.

-پەشیمانی لەو تاوانەی کردووتە.

-نەگەڕانەوە بۆ سەری.

-کرداری باش لەگەڵ بوونی باوەڕ.

-گەڕانەوەی مافی ماددی و مەعنەوی بۆ خاوەنەکانیان.

## حەفتەم: نزاکردن:

خوای گەورە دەفەرموێت: **(رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً ۚ إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ)**[1] واتە: پەروەردگارا.. دوای ئەوەی ڕێنموویت کردین، دڵەکانمان لامەدە لە ڕێگەی ڕاست و لە ڕەحمەت و بەخششی تایبەتی خۆت بەهرەوەرمان بکە، چونکە بەڕاستی تۆ بەخشندە و بەخشێنەری.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆربەی پاڕانەوەکانی بریتی بوو لە : **(يا مُقلِّبَ القُلوب ثَبِّت قلبي على دينك)**واتە: ئەی ئەو خوایەی وەرگێڕی دڵانی دڵم دامەزراوو چەسپاو بکە لەسەر دینەکەت. دەربارەی ئەوە پرسیاریان لێ کرد؟ ئەویش فەرموی: هیچ کەسێك نییە ئیلا دڵی لە نێوان دوو پەنجەی خوای گەورەدایە،

---

[1] [آل‌عمران :٨ ].

ویستی لێ بێت لە هەرکەس دامەزراوی دەکات و ویستی لێ بێت لە ڕێگا لای دەدات.[١]

وە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: **((إن الإيمان ليخلق في جوف أحدكم كما يخلق الثوب فاسألوا الله تعالى : أن يجدد الإيمان في قلوبكم))**[٢].واتە: ئیمان لە دڵی هەر یەکێك لە ئێوەدا کۆن دەبێت هەر وەك چۆن پۆشاك کۆن دەبێت و دەڕزێت. جا لە خوای گەورە داوابکەن کە ئیمان لە دڵەکانتاندا نوێ بکاتەوە.

---

[١]/. أخرجه الترمذي وصححه الألباني أنظر صحيح الجامع(٤٨٠١). عن أم سلمة

[٢]أخرجه الطبراني وغيره عن ابن عمر وصححه الألباني أنظر صحيح الجامع(١٥٩٠)

**هەشتەم: بەردەوام بوون لەزیکرو یادی خوای گەورە:**

بە دڵ و زمان بە بەردەوامی بە پێوەو بە دانیشتن و بە ڕاکشان..لە هەموو کاتەکانی ژیاندا...خوای گەورە دەفەرموێت: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ)**[1] واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە: کاتێک دەگەنە دەستەیەک و ڕوو بە ڕووتان دەبنەوە، ئەوە دەبێت خۆڕاگربن و سەنگەر چۆڵ نەکەن و زۆر یادی خوا بکەن و لێی بپاڕێنەوە، بۆ ئەوەی ئێوە سەرفرازو سەرکەوتوو بن.

---

[1] [الأنفال :٤٥ ].

## نۆیەم: هاوڕێی باش و خواناس و دامەزراوو هیممەت بەرز دەستنیشان بکە:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: **(( -المرءُ على دينِ خليلِه فلينظرْ أحدُكم مَن يُخاللُ))**[1]. واتە: هەموو کەس لەسەر دین و ئاینی هاوڕێ و خۆشەویستەکەیەتی، جا هەر یەکێك لە ئێوە با تەماشا بکات و بزانێت هاوڕێیەتی کێ دەکات..

هەربۆیە وتویانە: (الصاحب ساحب)..واتە: هاوڕێ ڕاکێشەرە.

---

[1] أخرجه أبوداود والترمذي عن أبي هريرة وحسنه الألباني. أنظر صحيح الجامع(٣٥٤٥).

**دەیەم: لێپرسینەوە لە نەفس:**

خوای گەورە دەفەرموێت: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ)** [1] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، خواناس و پارێزکاربن و لە سنوورەکانی مەترازێن، با هەموو کەسێك سەرنج بدات و بزانێت چی بۆ سبەی دەست پێشکەری کردووە، هەوڵ بدەن هەمیشەو بەردەوام پارێزکارو دیندارو خواناس بن، چونکە بەڕاستی خوا زۆر ئاگایە بەهەموو ئەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

عومەری کوڕی خەتتابیش (ڕەزای خوای لێ بێت) دەیفەرموو: **((حاسبوا أنفسكم قبل أن تحاسبوا. وزنوا انفسكم قبل أن توزنوا. وتزيّنوا للعرض الأكبر))** [2]. واتە : لە نەفسی خۆتان

---

[1] [الحشر :١٨ ].

[2] تأريخ عمر –ابن الجوزي -٢٠١.

بپرسنەوە پێش ئەوەی لە قیامەتدا لێتان بپرسرێتەوە. وە کردەوەکانتان بکێشن پێش ئەوەی لە قیامەتدا بکێشرێت.وە خۆتان بە کردەوەی جوان بڕازێننەوە بۆ نمایش کردنە گەورەکەی قیامەت.

جا بەڕاستی چاکترین ئیماندار لەڕۆژی دوایی دا ئەو ئیماندارەیە کە زۆر لێپرسینەوەی خۆی دەکات.

## یازدەم: ئارامگری لەسەر نوێژ و کردەوەی چاك و چاوەڕێی پاداشت:

خوای گەورە دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ ۚ إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ)[1] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە داوای کۆمەك و یارمەتی لە خوا بکەن بەهۆی ئارامگرتن و نوێژکردنەوە، دڵنیابن کە خوا یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێت: ((...وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً خَيْرًا وَأَوْسَعَ مِنْ الصَّبْرِ))[2].واتە: هەرکەسێك هەوڵ بدات ئارامگری لە خۆیدا دروست بکات ئەوا خوای گەورە ئارامگری پێ دەبەخشێت. وە هیچ کەسێك

[1] [البقرة :١٥٣ ].

[2] البخاري(٦١٠٥) ومسلم(١٠٥٣)

بەخشش و چاکەیەکی پێ نەبەخشراوە باشتر و فراوانتر بێت لە ئارامگری.

## دوازدەم: هێشتنەوەی دڵ بە سەلامەتی:

**چەند هۆکارێك هەن بۆ هێشتنەوەی دڵ بە سەلامەتی لەوانە:**

-چاك کردنی کردەوەکانی دڵ وەك (دڵسۆزی لە گوفتارو کردەوەکان بۆ خوای گەورە)

-ڕق بوونەوە لە ناوبانگ دەرکردن.

- خۆپاراستن لە باسکردنی خەڵك.

-خەریك بوون بە چاك کردنی نەفس و عەیبەکانی خۆت

- خۆ بەکەم زانین .

- خۆ ئامادەکردن بۆ دوارۆژ .

- بە فیرۆ نەدان و پاراستنی کاتو تەمەن.

- ساغ کردنەوەی دڵ لە کینە و فیڵ و ئیرەیی.
- خۆ بەدەستەوەدان بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ .
- بایەخ دان بە دین و بانگەوازی بۆ کردن بۆ لای خوای گەورە.
- ترسان لە خوای گەورەو هەست کردن بە چاودێری کردن لە ئاشکراو نهێنییەکانداو هەوڵدان بۆ تەوبە کردنو واز هێنان لە تاوان.
- پابەند بوون بە پەیمانو گێڕانەوەی ئامانەت.
- ڕاستگۆیی لە قسە کردنداو قبوڵ کردنی حەق لە هەر کەسێکەوە بێت.
- زیکر و یادی خوای گەورە و قورئان خوێندن چونکە یەکێک لەگەورەترین هۆکارەکان بۆ سەلامەتی دڵ خوێندنی قورئان و وردبونەوەیە لەئایەتەکان و زیکر کردنە بەدڵ و زمان هەروەکو خوای گەورەش دەفەرموێ: [أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ]

[الرعد:٢٨]، واتە: بێگومان بەزیکری خوا دڵەکانمان ئارام دەبێتەوە.

## سێزدەم: جێگیربوون بەرزترین وگەورەترین پلەی بەندایەتیە:

خۆشبەختی بۆهەموو ئەوانەی لەکاروانی خواپەرستیدا کۆڵ نادەن و دانابڕێن و بەردەوامن، گەورەترین و خۆشترین موژدەی خوا بۆ ئەوکەسانەیە کەبەردەوامیان هەیە لەسەر بەندایەتی کردنی خوای گەورە،بۆیە هیچ پلەیەك ناگاتە ئەو پلەو پایەیەی مرۆڤ دەستی دەکەوێت بەئیستیقامەکردن لەسەر ئاینی خوای گەورە،

خــوای گەورە دەفەرموێــت: (إِنَّ الَّــذِينَ قَــالُوا رَبُّنَــا اللَّهُ ثُــمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَآئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا ولاَ تَحْزَنُوا وأَبْشِرُوا بِالْجَنَّـةِ الَّتِى كُنْـتُمْ تُوعَـدُونَ (٣٠) نَحْـنُ أَوْلِيَـاؤُكُمْ فِى الْحَيَـاةِ الـدُّنْيَا وفِى الْآخِـرَةِ ولَكُمْ فِيهَا مَا تَشْـتَهِى أَنْفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا

تَـدَّعُونَ (٣١) نُـزُلًا مِـنْ غَفُـورٍ رَحِـيمٍ(٣٢))[١]. واتە: بـەڕاسـتی ئەوانەی وتیان خـوا پەروەردگارمانـەو لەپاشـان ڕاسـت (لەسـەر ئـایین) بـەردەوام بـوون فریشـتـەكان پـۆل پـۆل دێنـە لایـان (كاتی مـردن یـان زینـدوو بوونـەوە) (پێیـان دەڵـێن) كـە مەترسـن و خەفەت مەخۆن وە مژدەبێ لێتان ئەو بەهەشتەی كە بەڵێنتان پێ درابوو.

ئێمـە لـەژیانی دنیـا و لـە ڕۆژی دواییـدا دۆسـتی ئێـوەیـن وە لـەو (بەهەشتەدا) هەرچی حەزی لێ بكەی بۆتان ئامادەیە وە هەرچی داوا بكەن لەوێدا لە خزمەتتاندایە.

ڕێز لێنان و میوانداریە لەلایەن خوای لێبوردەی میهرەبانەوە.

---

[١] فصلت (٣٠)_(٣٢)

## چواردەم: بەردەوامبوون لەبەندایەتیدا دەرگاو دەروازەی سەرفرازیە:

خوای گەورە لەقورئاندا باسی مرۆڤەكان دەكات كە شپرزەو لاوازن لەكاتی ناخۆشیدا داڕوخاون، لەكاتی خۆشی و ئاسوودەییشدا دەست نوقاو و ڕەزیل و مەغروورن، تەنها ئەوانە نەبێت كەبەردەوامن لەسەر پەرستنی خوا بەتایبەتیش نوێژ كردن ، خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنَّ الْإِنْسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا (١٩) إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا (٢٠) وإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا (٢١) إِلَّا الْمُصَلِّينَ (٢٢) الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ)[١]

بەڕاستی مرۆڤ وا دروستكراوە كە زۆر سوورە لەسەر شتەكان و داكۆكیان لێدەكات(١٩)كاتێك كە تووشی خراپەیەك بێت لە

---

[١] المعارج

فەقیری و هەژاری و نەخۆشی و دەردو بەڵا ئەبینی زۆر نائارامەو ئارام ناگرێ و بێئومێد ئەبێ(٢٠)وە ئەگەر هاتوو تووشی خێرێکیش بێ لە دەوڵەمەندی و پیت و بەرەکەت و ڕزق و ڕۆزی ئەو کاتە ئەبینی کە قەدەغەی خێرو چاکەی لێ ئەکات و ڕەزیلی و چرووکی دەکات(٢١)تەنها ئەو نوێژخوێنانە نەبێ(٢٢)تەنها ئەو نوێژخوێنانە نەبێ کە لەسەر نوێژەکانیان بەردەوامن و پارێزگاری لێ دەکەن و لە کاتی خۆیدا ئەنجامی ئەدەن بە روکن و واجبات و خشوعەوە، وە دڵیان لای نوێژەکانیانە(٢٣)

موژدەی بەردەوامبوونەکەشیان ئەوەیە دەفەرموێت: (أُولَئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُكْرَمُونَ)[1] واتە: ئائەوانە لەباخەکانی بەهەشتدا ڕێز لێندراون.

---

[1] المعارج (٣٥)

کەواتە دەڵێین مەوەستن و کۆڵمەدەن بەردەوامبن لەکاروانی بەندایەتی کردن بۆخوا، چونکە سەفەری قیامەت سەفەرێکی زۆر دوورو درێژەو هەورازو نشێوی زۆری تێدایە، ئەم سەفەرەش پێوستی بە ئامادەکاری و تووێشوی باش هەیە بۆ ئەم ڕێگایە.

## پازدە:- پشت بەستن بە خوای گەورە و داواکردن لەوزاتە مەزنە لەگەڵت بێت بۆ گەشتن بە مەبەست(استعانە):-

فێر بیت ئەوەی ڕاتیگرد لەسەر پەرستن لە مانگی ڕەمەزان ئەوا (اللە عزوجل)ە و تەنها خۆی دەتوانێت بەردەوام بوونت پێ ببەخشێت، بەردەوام بوون هێز و توانا نییە لە تۆوە، بەڵکو بەخشش و ڕۆزییەکە کە خوای گەورە پێت دەبەخشێت کە سەرت دەخات بۆ پەرستنی و دواتر لێت وەردەگرێت، و دانان بەم کارە سەرەتای جێگیر بوونتە.

بەڵام گەر سەیری کارە چاکەکانت بکەیت بە گومانی ئەوەی کە لەخۆتەوەیە و لە هێز و توانای خۆتە، ئەوا خوای گەورە بۆ خۆت جێت دەهێڵێت، و هەر کەس خوای گەورە بۆ خۆی جێی بهێڵێت تێدەکەوێت و لەناودەچێت، بۆیە ڕابەری نازدارمان ﷺ دەفەرمێت: **(ولا تَكلني إلى نفسي طَرفة عين ابداً)**[1]

واتە:- هەرگیز مەمدەرە دەست نەفسی خۆم بۆ چاو تروکانێکیش بێت.

---

[1] رواه النسائي في السنن الكبرى،والبزار والحاكم وقال :هذا حديث صحيح على شرط الشيخين .وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة

## شازده_تێكۆشان:-

بزانیت كه بەردەوام بوون به خەوتن و پاڵدانەوە چێژ بینین له هەموو خۆشی ئارەزووەكان نابێت، بەڵكو به تێكۆشان و بەردەوام بوون و درێژه پێدان و دەبێت.

تێكۆشان له دژی نەفس و ئارەزوو و شەیتان و ئارامگرتن لەسەر ئارەزوو و قەردەغەكراوەكاوەن، خوای باڵادەست دەفەرموێت:- {وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ}[1] واته:- كەسانێ كه له پێناو ڕەزامەندی ئێمەدا تێكۆشانیان كردووه بەڕاستی ڕێنموونیان دەكەین بۆ ڕێبازەكانی خۆمان وه بێگومان خوا لەگەڵ چاكان دایه.

{وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ}[2] واته:- لەناو ئەواندا پێشەوایانێكمان دانا ڕێنموونیی

[1] العنكبوت:٦٩
[2] السجده: ٢٤

(خەڵك) یان دەكرد بە فەرمانی ئێمە كاتێ خۆیان گرت و بە ئایەتەكانی ئێمە دڵنیا بوون (باوەڕی پتەویان) هێنا.

ﷲ تعالی بەردەوامیت پێ نابەخشێت و چێژ و پاداشتەكەیت پێ نادات، تەنها لە كاتێكە ئەگەر درێژەت پێی دا و كارت لەسەری كرد و بانگی خەڵكیت بۆی كرد و تێكۆشایت تاكو پێی دەگەیت.

**حەقدە: بەگشتی پێویستە ڕەچاوی ئەمانەی خوارەوەش بكەین:**

-ئارام گرتن و پاراستنی گوێ و چاو و زمان لە حەرام.

-شەو نوێژ كردن بە تەدەبورو ملكەچی.

-پارێزگاری كردنی نوێژی كۆمەڵ لەمزگەوت دا وهەوڵ دان بۆ ڕیزی یەكەم و تەكبیری ئیحرام لەگەڵ ئیمام دا.

-پارێزگاری كردن لە نوێژی سوونەتی راتب.

-بەخشین و خێرکردن بە ئەوانەی پێویستیانە.

-سەردانی نەخۆش،بەجێ هێنانی سیلەی ڕەحم،بەڕێکردنی جەنازە هەموو ئەوانە سوونەتن و پاداشتێکی گەورەو خێری زۆری هەیە.

-پارێزگاری کردن لە زیکرەکانی بەیانیان و ئێواران،یان هەرکاتێك کە پێویستی کرد.

-ئامادەبوون لە وانە زانستیەکان و فێربوونی زانست و خوێندنی بابەتەکانی وەک فیقهـ و عەقیدە.

-لەبەرکردنی هەندێ ئایەتی قورئانی پیرۆز و فەرموودەیەك یان زیاتر هەموو ڕۆژێ.

-خوێندنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

-زوو ئامادەبوون بۆ نوێژەکان.

-هەستان بە پێویستی بانگخوازی و فەرمان کردن بە چاکەو نەهی کردنی خراپە.

-بەردەوام بوون لەنەرم و نیانی و بەخشین دواى ئەم مانگە پیرۆزەش.

-نزاکردن و پاڕانەوەی بەردەوام بۆ ئەوەی خوای گەورە بەتەواوی جێگیرت بکات لەسەر ڕێگای ڕاستی ئیسلام و هەوڵدانی تەواو بۆ ئەو مەبەستە.

-پێشبڕکێ کردن لە چاك کردنی پەیوەندی نێوان خەڵك.

-سەرخستنی موجاهیدانی موسڵمانان.

-چاکە کردن لەگەڵ دایك وباوك دا.

-بەشداری کردنی نوێژی جەژن لەگەڵ موسڵمانان.

- ڕۆژووی شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال و کاتەکانی تر کە لەسوننەت ئاماژەیان پێدراوە.

-بەردەوام یادکردنەوەی خوای گەورەو سەڵاوات لێدان بەسەر ئازیزمان (صلى الله عليه‌وسلم).

## ڕامان:

گەر ڕەمەزان تەواو بێــت، ڕۆژوو و شــەو نــوێژ و قورئــان و پەرستن کەم ناکاتەوە.

هەرکەســێ ڕەمەزان بپەرســـتێت ڕەمەزان تەواو دەبێـــت و دەڕوات، هەرکەس الله ســبحانە وتعــالی بپەرســتێت ئەوا ئەو هەمیشە زیندووە و نامرێت.

وە خراپترین بەندە ئەو بەندەیەیە کە تەنها لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز پەروەرگاری خۆی دەناسێت.

خــوای گەورە ئاگاداری کــردوینەتەوە وەکــو بەلعەمــی کــوڕی بــاعورا نەبــین، زانــایەکی نەوەی ئیســرائیل بــوو خــوای گەورە شــیرینی ئیمــانی پێــی چەشــت و ئایەتەکــانی پێــی دا، دواتــر هەڵگــەڕایەوە لە بیروبــاوەڕەکەی و گــومڕای کــرِی بە ڕێنمــایی و سزای کرِی بە لێخۆشبوون و لە ئایەتەکانی الله تعالی دەرچوو هەروەک چۆن مار لە پێستەکەی دەچێتە دەرەوە، {وَاتْلُ عَلَيْهِمْ

نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانْسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ}[1] (ئەی محمد(ﷺ) هەواڵی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەرەوە کە فەرمانەکانی خۆمانمان پێبەخشی بوو، کەچی ئەویش خۆی لێ داماڵی و خۆی لێ دوورە پەرێز گرت، ئەوسا ئیتر شەیتان شوێنی کەوت و دایەپێش و چووە ڕیزی سەر لێشێواوانەوە.

دیسانەوە پەروەردگارمان جل وعلا ئاگادارمان دەکاتەوە وەکو ریطەی کچی سعد نەبین، ئافرەتێکی شێت بوو لە مەککە بەدرێژایی ڕۆژ ڕستنی دەکرد و لە کۆتای ڕۆژ خاوی دەکردەوە و دەیکردەوە خوری، {وَلَا تَكُونُوا كَالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنْكَاثًا}[2] واتە: (کاتێك بەڵێن و پەیمانێك دەدەن ئەمەك و وەفاتان هەبێت بۆ ئەنجامدانی) وەکو ئەو ئافرەتە مەبن کە

---

[1] الأعراف: ١٧٥

[2] النحل: ٩٢

ڕیسـەکەی دەکـردەوە بـە خـوری، دواى ڕسـتن و تۆکمـەکردنی هەڵی دەوەشاندەوە.

وە لە دایـکە عائشـە(خوای لـێ ڕازی بێت)یـان پرسـی کـاری سـەروەری نازدارمـان ﷺ چـۆن بـووە، فەرمـووی کاری بەردەوام بوو.

پێشـەوای ئەزیزمـان ﷺ دەفەرموێـت:- (خۆشەویسـترین کارەکان لەلای الله کارێکی بەردەوامە گەر کەمش بێت.)[1].

ئەم ئاگادارکردنەوە قورئانییانە جێبەجێ دەبێت لەسەر ئەو کەسـانەی چێـژی شـیرینی پەرسـتنیان چەشـتووە لە ڕەمەزان، پارێزگاریـان کـردووە لەسـەر ئەرکەکـان و وازهێنـان لە حەرامکراوەکان.

[1] موسلیم ڕیوایەتی کردووە

ئەو کەسانەی هەرکە مانگی ڕەمەزان تەواو بێت لە ئایەتەکانی خوای مەزن خۆی دادەماڵێت و، ڕستنەکەی خاو دەکردەوە دوای پێچانەوەیەکی تۆکمە.

ئەوانەی کە پارێزگاری لە نوێژەکانیان دەکەن و کاتێک ڕەمەزان تەواو دەبێت وازی لێدێنن و شوێن ئارەزووەکانیان دەکەون.

وە لەسەر ئەوانەی کە واز لە خواردنەوەی حەرام و بینینی حەرام و بیستنی حەرام دەهێنن و لەگەڵ تەواو بوونی ڕەمەزان دەگەڕێنەوە سەری.

وە لەسەر ئەوانەی دەچنە مزگەوتەکان و بەردەوام لەگەڵ قورئانی پیرۆز دەبن و لەگەڵ تەواو بوونی ڕەمەزان مزگەوتەکان و قورئانەکان بەجێ دەهێڵن.

خاوەن زانستەکان{أهل العلم} وتوویانە لە گەورەترین نیشانەی وەرنەگرتنی پەرستن و ڕەتکردنەوەی گەڕانەوەی

کەسەکەیە بۆسەر کارە ناشرینەکان دوای تەواو بوونی کاتی پەرستن.

**پەرستن تاکو مردن**، ئاینەکەمان فێری ئەوەی کردووین کە پەرستنەکان نابڕێنەوە و تەواو نابن بە تەواو بوونی وەرزەکانیان.

هەر وەرزێک تەواو بێت ئیلا خوای گەورە وەرزێکی تر دەکاتەوە.

لەگەڵ تەواو بوونی کۆتا شەوی ڕەمەزان مۆژدەی دەستپێکردنی وەرزی حەجکردن دێت، کە چەند مانگێکی دیاریکراوە، و یەکەم مانگی حەجکردن بە ڕێکەوتنی خاوەن زانستەکان سەرەتای شەوالە...

پێغەمبەری نازدارمان ﷺ ڕۆژووی شەش ڕۆژی مانگی شەوالی لەسەرمان سونەت کردووە، وەکو لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە لە باوکی ئەیوبەوە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ فەرموویەتی:- **{من صام رمضان و أتبعه ستا من شوال فذلك صيام الدهر}** واتە:- هەر کەسێک ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێت و بەدواییدا شەش ڕۆژی شەوال بگرێت ئەوا ڕۆژووی ساڵێکە.

و بۆ تەواو بوونی پەرستن هیچ شتێک نییە تەنها مردن نەبێت وەکو ئەوەی الله تعالى دەفەرمێت:- **{وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ}**[1] وە پەروەردگارت بپەرستە هەتا مردن یەخەت پێ دەگرێت.[2]

---

[1] الحجر: ٩٩

[2] لەبڵاوکراوەکانی ئیسلام وێب

ئەی پەروەدگارا چۆن بە گەورەیی و بەزەیی خۆت پەرستنی ڕەمەزانت کرد بە بەشمان، دوای ڕەمەزانیش بە گەورەیی و بەزەیی خۆت بێ بەشمان مەکە لێی.

و چۆن سەرکەوتوومانت کرد بۆ قورئانی پیرۆز و شەو نوێژ دوای ڕەمەزانش سەرکەوتوومان بکە.

**ئامین**

## لەکۆتاییدا:

بەداخەوە زۆرێك لەموسڵمانان هەر لەڕۆژی جەژندا بە جێگای ئەوەی سوپاسگوزاری خوای گەورەبن کە تەوفیقی داون بەندایەتی بۆ بە جێ بێنن، ئەوانە بە خۆڕازاندنەوەی ناشەرعی و زێدەڕۆی لە خواردن و ڕابوردن و گوناحی جۆراوجۆر، پێشوازی لە ئازاد بوونی بەندکراوەکان دەکەن.

پێویستە لەسەرمان بەردەوامبین لەسەر چاکەکردن لەهەموو ڕوێکەوە، بەتایبەتیش کردنی نوێژەکانمان بەکۆمەڵ خۆ ئەگەر وەکومانگی ڕەمەزانیش نەتوانین مزگەوتەکان ئاوەدان بکەینەوە لەبەر ئیشوکارو سەرقاڵی، با تەرکی نەکەین و تابۆمان دەکرێ نوێژەکانمان با بەکۆمەڵ بێت، بزانن ڕێگای مزگەوت ڕێگای ڕێنوێنییە هەرکەسێك بیگرێتەبەر ئەوا ڕێگای هیدایەتی دۆزیوەتەوە، هەرکەسێك وونی کردبێت ڕێگای سەرفرازی ون کردووە، هەروەرها پاراستنی چاو و گوێ و تەواوی جەستەمان لەشتە حەرام کراوەکان و بەگشتی پارێزکاری بکەینم لەدەست

کەوتەکانی مانگی پیرۆزی ڕەمەزان ئەوەش بەم شێوەیەدەکرێت کە پشت لەئاینی خوانەکەین و هەرگیز هیچ کارێك ئەنجام نەدەین کە بۆنی شیرك و کوفری لێبێت، چونکە پێویستە بزانین شەریك دانان ئەو تاوانەیە کە هەمووکردەوەکان پوچەڵ دەکاتەوە، خوای گەورە وەحی بۆهەموو ئوممەتان کردووە بەوەی: لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ ولَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ.الزمر (٦٥)



اللهم يا مُقَلِّبَ القُلُوبِ والآبْصَارِ ثَبِّتْ قُلُوبَنَا عَلى دِيْنِكَ وطاعَتِكَ " امين

سالارعومەر

١٨ ی ڕەمەزانی ١٤٤٣ ی کۆچی